بەڕێوەبەرایەتی
زنجیرە کتێبی منداڵان



# کچە جوانیلە





نوسینی: جەلیل حەمەسەعید
نیگار: مەریوان گەلاڵی

# چیرۆکی کچە جوانکیلە

کچە جوانکیلەی گەڕەك ناوی ( ڕۆژان ) بوو. . دایك وباوك و تەنانەت خەڵكی گەڕەکەکەش، حەزیان دەکرد قسەی لەگەڵدا بکەن. ماڵی پورە زەینەبی دراوسێیان ماست فرۆشن. دایکی دەینێرێت بۆ ماست کرین لەبیری دەچێت جارێکی تریش ناردبوویان، پێیان گوتبوو : ماستمان نییە مانگاکەمان وشکی کردووە. ڕۆژانیش قسەی دایکی ناشکێنێ، دەڕوا، لەدەرگای ماڵی پورە زەینەب دەدات،







دەڵێن کێیە؟ ئەویش دەڵێ بەندەیەکی دوو پێیە.
دەڵێن فەرموو چیت دەوێ؟
دەڵێ:- ئێشم بە ( پورە تپێ ) یە.
مانگاکەش لەو کاتەدا دەبۆڕێنێ،
پورە زەینەب دەڵێ:- کچی خۆم، ئەوەتا مانگاکەش دەڵێ کوا شیرم پێیە؟
ڕۆژانیش دەست دەکات بە پێکەنین و دەڵێ:- وامزانی دەڵێ چیت پێیە؟
خەریکبوو بڵێم سەتڵی بەتاڵم پێیە.
ئەمجارە بەرەو ماڵەوە دێتەوە و ئەم گۆرانیە دەڵێ:-



دام لەدەرگای ئەو ماڵە

هاواریان لێم کرد کێیە؟

منیش بەبێ سێ و دوو

گوتم بەندەی دوو پێیە

گوتیان فەرموو چیت دەوێ

کارم بە( پورە تپێ ) یە

پورە تپێ کەوتە بۆرە

گوتی کوا شیرم پێیە؟

منیش بۆ ماڵ هاتمەوە

سەتڵی بەتاڵم پێیە.



# هاوكارى



قەڵەم دەگەڕاو دەیگوت من وێنە دەزانم دەمەوێ وێنە بكێشم، بەڵام نەیدەزانی لەسەر چی و چ جێگایە هەڵبژێرێ بۆ ئەوەی وێنەكە بە جوانی بكێشێ و پیشانی خەڵكی بدات. تا پەڕاو هاتوو گوتی:- لەمن زیاتر نییە تۆ وێنەی لەسەر بكێشی قەڵەم ویستی دوو ڕاستەهێڵ بكێشێ نەیدەزانی چۆن بیكێشێ



تا ڕاستەهێڵ گوتی من دەتوانم ئەو هونەرە بنوێنم. قەڵەم دەستی کرد بە وێنەکێشان نووکی شکا دیسان داما
نەیدەزانی چۆن نووکی خۆی بێنێتەوە دەرەوە





تا دادەر هات گوتی من دەتوانم نووکت بۆ دادەم .

قەڵەم دووبارە کەوتەوە سەر بەجێهێنانی هونەرەکەی هەڵەیەکی کرد، نەیدەزانی چۆن بیسڕێتەوە. ناچار وەستا تا لاستیك پێی گوت من دەتوانم ئەو کارەت بۆ جێبەجێ بکەم و لە ترسی هەڵەش ڕزگارت بکەم چونکە هەرکاتێ هەڵەت کرد من دەیکوژێنمەوە. قەڵەم بەردەوام بوو تا وێنەکەی تەواوکرد. ئینجا ویستیان ناوێکی لێ بنێن سەریان هێناو سەریان برد هەر ناوێکیان لێ بنایە ڕەنجی گشتی پێوە نەبوو



تا منداڵێك بە جانتایەکەوە هات وێنەکەی بینی و گوتی بەڕاستی هاوکاری کاری جوان و سەرکەوتنی بەدواوەیە ، ئەم وێنەیە وێنەیەکی هاوکارییە جانتاکەش گوتی ئەوە منیش دەبم بە ماڵی ئەم بەڕێزانە .

ئیتر ئەوانیش لەو ڕۆژەوە ناتوانن لەیەك دابڕێن هەر بە هاوکاری هەموویان کاریان جێبەجێ دەکەن و سەرکەوتووشن منداڵکەش گوتی ئەوە منیش بۆ هەر کوێ بتانەوێ دەتانگێڕم و جانتاکە دەکەمە شان ئەوانیش گوتیان هەموو ڕۆژێ بۆ قوتا بخانەمان ببە ، منداڵەکەش بوو بە قوتابی قوتا بخانە .

# لانە دایك و باوكی تاقی دەكاتەوە

لانە لەنێوان دایك و باوكی دانیشتبوو، بە باوكی گوت :- بۆچی هەر دایكم خزمەتمان بكات و تۆ دەبێت هەر كاری كێڵگە بكەیت ؟ ئەی دایكم ناتوانێت ئەو كارە بكات ؟

باوكی گوتی :- ئاخر كارەكەی من گرانترە خۆم حەز دەكەم كارە گرانەكە بكەم، چونكە لەشی من بەرگەی زیاتری گەرمی و ماندوو بوونیش دەگرێت و بە ئاسانێش ناشێوێت،

لانە گوتی :- حەز دەكەم دایكم لە كارەكەی تۆ تاقی بكەمەوە و تۆش لەو كارەی ماڵەوەدا چونكە بیستوومە ژن و پیاو وەك یەكن لە كاردا







لەسەر بڕیاری لانە دایکی ڕۆژانە بۆ کێڵگەکە دەچوو و باوکیشی لە ماڵەوەی بوو

لانە هەستی کرد دایکی ڕۆژ بە ڕۆژ لاواز دەبێت و باوکیشی لە ماڵەوە هەر خەریکی خەوە و خۆیی و هەردوو براکەشی تا دێ پیس و پۆخڵ و ماڵیشیان شێواو و ناشرین دەبێت، لە وانەکانی قوتابخانەش نمرەکانی کەمتر دێنێت و هاوڕێکانی بە چاوی جاران تەماشای ناکەن

بۆیه ناچار پاشگەز بووەوە و داوای لە دایك و باوكی كرد هەریەكەیان بۆ كاری خۆی بگەڕێتەوە و جارێكی تر داوای كاری وایان لێناكات، دایك و باوكی گەرانەوە سەر كاری خۆیان و ماڵیان وەك جارانی لێهاتەوە. پاش مانگێكیش لانە پرسیاری لە مامۆستا كرد:- مامۆستا ئەم مانگە لەگەڵ مانگی پێشوو چۆنم ؟

مامۆستا گوتی :-ئەرێ بەراست تۆ مانگی پێشوو زۆر خراپ بوویت تەنانەت شێوازیشت شێواو بوو، خۆ شتێك رووی نەدابوو ؟

لانە گوتی :- نەخێر بەڵام دایك و باوكم لەسەر داوای من كارەكانیان گۆری بووەوە، باش بوو زوو بە هەڵەم زانی، وا بڕۆشتایە ماڵمان دەشێوا چونكە منداڵ هەر لە قوتابخانە پەروەردەی تەواو نابێت بەڵكو نیوەشی دەگەرێتەوە بۆ دایك و باوك و دەورو بەرەكەی، ئیستا من بۆم دەركەوت دایك هونەرێكی پەروەردەیی پێیە بەهۆی ئەم هونەرە جوانەوە لەگەڵ كارە گرانەكانی باوك بەرامبەر دەبنەوە و هەردووكیان تەواوكەری پەروەردەن هەریەك بەكاری خۆی.

مامۆستا ئافەرینی كرد و بە قوتابییەكانی گوت:- چە پەلەیەكی جوانیان بۆ هێنایە كایەوە كە دانی بە هەڵەكەیداناو زۆریش پاشگەزبووەوە.

# شێری لە خۆبایی





هەبوو نەبوو شێرێك هەبوو زۆر گەورەو بەهێز بوو، لەبەر هێزی خۆی نازی
بەسەر گیاندارانی دارستاندا دەكرد و
دەیگوت:- لەدارستاندا لە من بەهێزو بەتواناتر نییە !

ڕۆژێکیان شێرەکە لەناو دارستاندا دەگەڕا دیتی جاڵجاڵۆکەیەك خەریکی داوچنینیە، بەدیاریەوە دانیشت تا داوەکەی تەواو کرد ... زۆر سەری لەوەسوڕما کە جاڵجاڵۆکەیەك بەو بێهێزییەوە خاوەنی چ هونەرێکە ! جاڵجاڵۆکەکە زانی شێر بەبیرێکی قوڵداچووە ، لێی پرسی :- پاشا خێرە وا مێشکی خۆت بەمنەوە قاڵ دەکەیت ؟ شێرەکە گوتی :- تۆ خۆت خاوەنی پیشەکەی، بۆیە لات ئاسانە، بەڵام لای من پیشەکەی تۆ لەهێزی من گەورەترە، چونکە پیشەکەی تۆ هەر دەمێنی، بەڵام ئەوەی من لەگەڵ خۆمدا دەڕوات و کەس ناوم ناهێنێت.





# تاقی کردنەوە

هەموو چین و توێژێك دابو نەریتی خۆی بەلاوە باشە، ڕێویش لەسەر خووی باب و باپیرانی بە فێڵ و بە تەڵکەبازی ڕاهاتووە، بە لایشییەوە کارێکی نارەوا نییە. ڕیوێ چەند ڕۆژێك بوو بێچووەکانی فێرە فێڵی ڕاو دەکرد، لەناکاو چاوی بە ئاسکێك کەوت و بینی دوو بەچەکەی جوانی بە دواوەیە، بەڵام لەترسی شاخە درێژەکانی دایکیان نەیدەوێرا لێیان نزیك بێتەوە، بیری لە بیرۆکەیەك کردەوە،

ڕووی کردە بێچووەکانی و گوتی :- ئەوە چەند ڕۆژە من پەراوە بە ئێوە دەکەم کاتی ئەوە هاتووە تاقیتان بکەمەوە،

ئینجا گوتی :- من خۆم لە پاڵ ئەو بەردە حەشاردەدەم بزانم دەتوانن ئەو دوو بێچووە ئاسکە ڕازی بکەن و بیهێنن بۆ لای دایکتان



دوو بێچووە ڕێوییەکە لە بێچووەکانی ئاسك نزیك بوونەوەوە و کەوتنە گفتوگۆ، قسە لووسەکانی دایکیان دەکرد بەزەییمان پێتان دێتەوە بۆ وا ژێر دەستی دایکتانن هەرچی گیانەوەر هەیە یەك جار دەژی، ئیتر ئەم ترسە بۆچییە، وەرن وەك ئێمە دوور لە دایکتان بژین. باوەڕتان بە خۆتان نییە ؟! بێچووە ئاسکە نەفامەکان، قسەکانیان بەلاوە ڕاست بوو، بەلاَم لەترسی دایکیان نەیانئەوێرا بڕیاری تەواو بدەن و بکەونە شوێنیان.
بۆیە گوتیان :- دایکمان زۆر بەهێزە لەقسەی دەرناچن دەمانکوژێ، دایکیان لە پشتەوە گوێی لە گفتوگۆکەیان بوو گوتی :- ئێوە لە ئەمڕۆوە ئازادن بۆ کوێ دەچن بچن. بێچووەکانی ئەم قسەیەیان زۆر بەلاوە خۆشبوو یەکسەر کەوتنە شوێنیان، نەیان دەزانی دایکیان تاقیان دەکاتەوە و لە دوورەوە چاویان لێ نابڕێت، چاویشی لەڕێوی بوو خۆی لە پشت بەردە گەورەکە حەشارداوە، ئەمیش بە دزییەوە چوو لەم دیوی بەردەکەوە خۆی حەشاردا،
ڕێوییەکان بە چکەکانیان هێنا، ئەمیش ئارامی گرت بزانێ چی ڕوودەدات ڕێوی ئافەرینی لێ کردن و گوتی :- بزانم خۆتان لە حەقیان دێن یان یارمەتیتان بدەم، بەچکە ئاسکەکان کە گوێیان لە دەڵە ڕێوی بوو گریان



گوتیان :- تازە تەواو بووین چۆن لە دایکمان دوور کەوتینەوە و، لە پڕ دایکیان لە پەنای بەردەکەوە هاتە دەرەوە و ڕێوی ئەوەندەی بۆ کرا بانگی بێچووەکانی بکات و بۆی دەرچێت. ئینجا دایکی ڕووی کردە بێچووە نەفامەکانی و گوتی :- ئیستا ئامۆژگارییەکانی دایکتان ڕاستە یان فێڵ و فڕی کەڵەك بازان؟ ئەی نازانن جارێ ئێوە هێزی ئەوەتان نییە پارێزگاری لە خۆتان بکەن، وا دەزانن دایکان لەسەر خێری بێچووەکانیان نین و دەیان چەوسێننەوە ئەوەش بزانن ئازاری دایك لە چاکەی فێڵ بازان چاکترە.





# پێشبڕکێ لەکارکردن

خۆر لەگەڵ بەیانی باشی ئاسۆ، چاوی بە توانا و ڕێزان کەوت، بەو بەیانییە زووە لەناو کێڵگەکەیان دانیشتبوون و چاوەڕێی باوکیان بوون کە کاریان پێ بسپێرێت و هاوکاری بکەن .

خۆر پێی گوتن :- بزانم ئەمڕۆ کێمان ئەتوانێت کاری زیاتر بکات و بۆ ژیانیش بەخشندەبێت ؟

هەردووکیان گوتیان :- هەی لەوە ! تۆ بەئاسمانەوە، دەبێت چ کارێکت لەدەست بێت، هەرگیز ناتوانیت وەك ئیمە کار بکەیت .

خۆر گوتی :- باشە ئیوارە کارەکانمان بە یەکتر رادەگەیەنین تا بزانین کێمان کارمان زۆرتر کردووە

ئێوارە کاتی ئەوە هاتبوو توانا و رێزان بۆ ماڵ بگەرێنەوە، خۆیان زۆرە بە ماندوو دەزانی،
خۆر پێی گوتن:- ئادەی کارەکانی خۆتان بڵێن،
توانا و رێزان گوتیان:- بنی دارەکانمان بژار کردووە هەڵیشمان گێرانەوە،
خۆر گوتی:- هەموو دەور و بەرتانم رووناك کردەوە تا ئێوە کاربکەن،
هەردووکیان گوتیان:- هەموو دارەکانمان بە ئاوی رووبارەکە تێر ئاو کرد.
خۆریش گوتی:- منیش چێشتم بۆ دارەکان ئامادە کرد،
هەردووکیان دایانە قاقای پێکەنین و
گوتیان:- لەکام چیشتخانە، بروایان نەدەکرد،
تادارەکان خۆیان گوتیان:- خۆر راست دەکات ئێمە
ئەو خۆراکەی لەزەوی بەهۆی رەگەکانمانەوە هەڵی دەمژین دەیدەینەگەڵاکانمان و خۆریش
بەهۆی تیشکە زێرینەکەیەوە بۆمان دەکاتە چێشت و دواییش بە لەشی خۆماندا دابەشی دەکەین بە یەکسانی.
توانا و رێزان گوتیان:- لە بەیانییەوە ئاگاداری کێڵگەکانمان دەکەین بۆ ئەوەی لەزیان بەدوور بێت،
خۆر گوتی:- ئەو ئاوە زیادەیەی کە لەشوێنە بێسوودەکان هەبوو کردم بە هەڵم و بەرزم کردنەوە بۆ ئاسمان تا
ببن بە هەور و باران و پێویستییەکانی کێڵگەکان دابین بکەن









خۆر بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی :- ئێوە دەرۆن دەنون، بەڵام من نانوم و نەمدیوی زەوی بەجێدەهێڵم و دەچم بۆ لای هاورێکانی ترم لەو دیوی زەوی تا ئێوارە کاردەکەم، بەیانیش دێمەوە بۆ لای ئێوە.

توانا و ڕێزان زۆر بەلایانەوە سەیر بوو کە خۆر ناخەوێت شەو و ڕۆژ لە کاردایە، بۆیە پەشیمان بوونەوە و گوتیان :- داوای لێبووردنت لێدەکەین هەرگیز کاری تۆمان پێناکرێت، بەڕاستی تۆ زۆر بە توانا و بەخشندەیت بۆ ژیان،

خۆر گوتی :- منیش ئافەرینی ئێوە دەکەم کە لەئێستاوە شانبەشانی باوکتان کاردەکەن، مرۆڤ بەکارکردنەوە جوانە، پێشینانیشتان گوتوویانە ( دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە ).

# ژیرك بارمەتی ریوی دەدات كەچی شەقێك لە پاداشت وەردەگرێت



ڕێوی لەسەر كردەوە نا پاكەكانی، سەگ تەنگاوی دەكەن،
دەزانێت بیگرن دەیخۆن،
لەتاو گیانی خۆی بەدارێكی بەرزدا هەڵدەگەڕێت
دوایی نازانێت چۆن دابەزێت، لەسەر دارەكە گیردەمێنێت،
لە پڕ كەروێشكێك بەوێدا دەڕوات ڕێوی بانگی دەكات و دەڵێت تۆ خاوەنی بەهرە و هونەری جوانیت، وەك
هاوڕێیەكی باش هونەرێكم بۆ بخە كار بەڵكو پێی بێمە خوارەوە. كەروێشك تەماشای دەكات بەو دارە بەرزەوەیە،
بۆیە سەری سووردەمێنێت، ڕێوی و بان دار !،
لە وەڵامدا دەڵێت:- قوربان ئەگەر هونەری چوونە سەرەوەم پێ بڵێیت منیش بیر لە هونەری هاتنە خوارەوەت بۆ
دەكەمەوە .
ڕێوی گوتی :- هاوڕێی خۆشەویستم، یەك دوو هاوڕێم لە گەڵدا بوو لە پڕ لە یەك ون بووین. گەرام نەمدۆزینەوە
ناچار گوتم با بچمە سەر ئەم دارە بزانم دەرناكەون
بەڵام لە هیچ لایەكەوە دیارنین. كەروێشك زانی ڕاستی پێنەوت،
بۆیە گوتی :- مام ڕێوی مادام تازە چوویتە ئەوێ باش سەیر بكە
هەموو كاتێك ئەو شوێنەت دەست ناكەوێت چاوی تێدا بگێڕیت.
باش چاو بگێرە با هاوڕێكانت بدۆزیتەوە ئەوجا بیر لە هاتنە خوارەوە بكەوە، من خوا حافیز





ژیژك گوێی لە ڕێوی دەبێت، داوا لە کەروێشك دەکات یارمەتی بدات بۆ هاتنە خوارەوە هیچی بۆ نەکرا ، بەزەیی بەڕێویدادێتەوە. دەڵێت قوربان من لە ژێر دارەکە رادەوەستم خۆت هەڵبدە سەر پشتم .

ڕێوی گوێی لە دەنگی ژیژك دەبێت، تەماشای دەکات لەبەر بچووکی دەنگی هەیە رەنگی نییە بە زەوییەوە دیار نییە ، دەڵێت خۆم هەڵبدەمە سەر چی ؟! لەم کاتەدا هەڵۆیەك هەست بە ڕێوی دەکات و بەرەو رووی دێت، ڕێویش لە ترسا بە دارەکە دەخزێتە خوارەوە



دەکەوێتە سەر پشتی ژیژك، دڕکەکانی ژیژك دەچێت بە لەشیدا ئازاری دەدات. هەڵدەسێت شەقێك لە ژیژك دەدات لە پاداشتی چاکەکەی.

ژیژك دەڵێت:- ئەگەر دەمزانی ئەوەندە نا مەردی یارمەتیم نەدەدایت با بۆ خۆت هەر لە سەر ئەو دارە بوویتایە.

ڕێوی گوتی:- دڕکەکانی تۆ لە کەوتنە سەر زەوی زیاتر ئازاریان دام.





# ئێمە یەکترمان خۆشئەوێ





کۆمەڵێ هاورێ لە نێو باخچەی گەرەك کۆببونەوە و باسی تەبایی و خۆشەویستیان دەکرد، مام ئەولای باخەوان لەنێو گوڵەکانەوە لێی پرسین:- خۆشەویستی نێوانتان تەواوە یان نا تەواوە ؟

هەموو گویان:- ئێمە یەکترمان زۆر خۆشەوێت .

گوتی:- زۆر باشە ، ئێستا دوو دوو دەست بکەنە ملی یەك و بن بە سێ بەشەوە، ئینجا هەربەشەیانی نارد بۆ جێگەیەك کە زەرفێکی داخراوی لێ دانابوو

لە زەرفەکە نووسرا بوو " ئەم دیاریە بۆ یەکێکتان " بەشی یەکەم و دووەم لەناو خۆیاندا بوو بە ناخۆشیان، چونکە هەریەکەیان ئەیویست دیارییەکە بۆ خۆی بێت. هەمووان لەیەك ئاڵابوون و زەرفەکانیش بە داخراوی مابوونەوە



تەنها بەشی سێ یەم  نەبێ پێکەوە زەرفەکەیان کردەوە و گۆڤارێکی جوانیان لێ دەرهێنا و بە بێدەنگی دەستیان کرد بە خوێندنەوەی








مام ئەولّا بانگی کردن و گوتی :- ئیستا بۆم دەرکەوت تەنها بەشی سێ یەم خۆشەویستی تەواو لەنێوانیاندایە، چونکە هیچ شتێك ناتوانێ خۆشەویستی تەواو تێکبدات، بەلام خۆشەویستی ناتەواو وەکو بەشی یەکەم و دووەم هەر شتێك بکەوێتە نێوانیانەوە وەك ئەو زەرفە هەر بە داخراوی ئەمێنێتەوە، نەخۆیان و نە دەور و بەریان سوودی لێ وەرناگرن، ئیتر لەو ڕۆژەوە لە خۆشەویستی ڕاستەقینە تێگەییشتین و بڕیاریاندا یەکتریان خۆش بووێت .



# هانیا هاوکاری دایکی دەکات





لە پاش بەرچایی بەیانی (هانیا) خۆی کرد بە ژووری چێشت لێناندا و پرسیاری کرد ؟ دایە بۆ نیوەڕۆ چیمان بۆ ئامادە دەکەی؟ حەز دەکەم هاوکاریت بکەم،

دایکی گوتی :- باشە کچی خۆم بابزانم نۆرەی کام مەنجەڵە ئینجا پیت دەڵێم حەزت لە چییە؟

هانیا گوتی هەی لەوە مەنجەڵ کوا قسە دەکات ! ،

دایکی گوتی :- بەڵێ ئەوەی چێشتی پێ لێ دەنێت لە زمانی حاڵی دەبێت، ئا نۆرەی مەنجەڵە گەورەیە حەزی لێیە ببێت بە وڵاتی برنج، سلق، تەماتە، کولەکە، باینجان، بیبەر، سیر، پیاز، کەرەوز، دۆشاو، ڕۆن، گۆشت، ترش، خوێ، بەهارات ...

هانیا گوتی :- دایە چێشتخانەکە ئەوەندە شت دەگرێت !؟ مەنجەڵە گەورە بۆ ئەوەندە تەماحی گەورەیە،

دایکی گوتی :- تۆ حەقت نەبێت وەرە با دەست پێ بکەین

نیوەڕۆ کە باوکی هانیا هاتەوە هەستی بە بۆنێکی خۆش کرد ڕووی کردە هانیا و گوتی : چیمان هەیە ؟
هانیا گوتی : من نێوی شتەکان دەڵێم بزانم خۆت دەزانم چیمان هەیە؟



قا پێك بر نجی شۆراو
بەبەهارات و دۆشاو
سیر و پیاز و کەرەوز
قرچا لە رۆنا بەریز
بە خوێ کەمێ سوێرمان کرد
تەواو ئامادەمان کرد
ئە مجا مە نجەڵی هاورد
بەرۆن ژێرەکەی چەور کرد
ساقە سلقی تیا راخست
عابا بە سەر تیایا نووست
لێی راکشا بەبەرا
گۆشتیشی دایە سەر
جا کولەکە و باینجان
تەماتە و بیبەری جوان
ورگیان لێ پڕ کرد گشتیان
مە نجەڵ بوو بە وڵاتیان
ئاوی ترشی کردە سەر
بۆ هەمووی چوو دیواو دەر
گەلێك کەس بۆی بەداخە
باوکی زانی یا پراخە

دایانە قاقای پێکەنین و دەستیان شۆردو رووبان کردە ژووری چیشت لێنان بۆ نان خوارد.

# گوێدرێژ لە ئازادی پاشگەز دەبێتەوە

لە بەهارێکی زۆر خۆشدا گوێدرێژێك تەماشای دونیای دەکرد لەوەڕ زۆر و ئاو و هەوا خۆش ،
گوتی :- بۆ ئێمەی گوێدرێژ وەك ئاژەڵانی تر بە ئازادی نەژین، چیمان لەوان کەمترە ؟!چووە لای پاشا و پێی گوت،

پاشاش گوتی :- من لە باوبا پیرا نمەوە بیستوومەگوێدرێژ بە ئازادی هەژار و بێ کەس خۆی نیشان دەدا ، چونکە لە خواردن و خەوتن و باربردن زیاتر هیچ نازانێ، هەر دەبێ بە خزمەتکاری بژی و ئەوسا خاوەنی شوێن و خواردنی بۆ دابین دەکات لە وەرزەکانی ساڵدا .

گوێدرێژ گوتی :- ئەگەر پاشامان ئازادمان بکات مشووری خۆمان دەخۆین، پاشاش لەسەر داواکاری خۆیان ئازادی کردن کردن



بەهار رۆیی هاوین هات زۆر بە نارەحەت و رەزالەت بردیانە سەر لەبەر ئەو خۆرە گەرمە ، پاییز هات و گەلا وەری و پووش ووشك بوو ، زستان هات و سەرما تەنگی پێ هەلچنین ، هەر چەند هەولیاندا نەیانتوانی خواردن و شوێن بۆ خۆیان دابین بکەن هەر بەیەکدا دەهاتن ئینجا بۆیان دەرکەوت هەر دەبێ بە خێو بکرێن . لەبری ئەوەش خزمەتکاری بکەن ، بۆیە روویان کردەوە لای پاشا و پاشگەزبوونەوە ، بڕیاری ئەوەیاندا چاو لە دەوروبەری خۆیان نەکەن . لەو رۆژەوە گوێدرێژ حەز دەکا هەر بە خزمەتکاری بژی .



# کچە جوانکیلە

وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی زنجیرە کتێبی منداڵان




زنجیرەی کتێب: ( ٩٠ )
ناوی کتێب: کچە جوانکیلە
نوسینی: جلیل حەمەسعید ڕەشید
دیزاین: شەمێران حەمید
نیگار: مەریوان گەلاڵی
هەڵەچن: سوزان محەمەد
تایپ: شهید صلاح الدین
سەرپەرشتیاری چاپ: عەبدولقادر عەلی مەردان
ژمارەی سپاردن: (٢٢٥٣)
تیراژ: ( ١٠٠٠ )
نرخی: (٥٠٠) دینار

خاوەنی ئیمتیاز: وەزیری ڕۆشنبیری و لاوان
سەرنووسەر: نیان ئەحمەد

زنجیرە کتێبی منداڵان لەسەر ئەم ساینە بخوێنەوە
www.kurdchap.com